# خێزانداری کەروێشک

نووسینی: فەرهاد عەبدولڕەحمان
نیگار: پەخشان گەلالی

هەردی جووتێک کەروێشکی نێرومێی بە دیاری لە ماڵی کوێخا ڕەسەن هێنابوو. لە گوندەکەی خۆیان و لە باخچەکەی کۆریتێکی بچووکی بۆ دروست کردبوون و ڕۆژانە گێزەر و کەرەوز و سڵق و گژوگیا و خواردنی تری پێدەدان. پاش شەش مانگ مام کوێخا ڕەسەن بۆ دڵنیابوون لە مانەوەی کەروێشکەکان سەردانی ماڵی هەردی کرد. کوێخا سەیری شوێنەکەیانی کرد دیاربوو کەروێشکەکان زیادیان کردبوو،و ببوون بە هەشت و چەند چاڵێکیان لە باخچەکە هەڵکەندبوو و لەم کون بۆ ئەو کون دەڕۆیشتن و یاریان دەکرد. کوێخا ڕەسەن ئامۆژگاری هەردی کرد و پێی گوت: دەبێت چاوت لە کەروێشکەکان بێت لەبەرئەوەی زیادیان کردوەو پێویستیان بە خواردنی زیاترە. دەبێت بیان پارێزیت چونکە هەموو وەک یەک خێزان وان. دەبێت بزانیت کە خێزانی ئەوانیش وەک هی ئێمە پێک دێت لە دایک و باوک و خوشکو برا. سەرەتا دوو بوون بەڵام بەهۆی چاودێریکردنو بەخێوکردنی دروستی تووە بوونە هەشت. هەردی گوتی: باشە مام کوێخا ئەگەر من نەبم ئەوانە چۆن دەتوانن خۆیان بەخێو بکەن؟ چونکە من خواردنیان دەدەمێ و خانووم بۆ دروست کردوون. مام کوێخا بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: کوڕم ئەوانیش دەتوانن خۆیان خانوو دروست بکەن و خواردن پەیدا بکەن و هەروەها سەرپەرشتی خانەوادەکەیان بکەن. ڕەوتی ژیانی هەر گیاندارێک لەوی کە جیایە، هەر خێزانێک بە شێوەیەکی جیا ژیان بەسەر دەبات هەر لە مرۆڤە ژیرەکان و ئاژەڵ و باڵندەکان تا گیانەوەرانی ناو دەریا. کەواتە ئەوانیش دەتوانن خۆیان بژیەنن. هەردی گوتی: باشە مام کوێخا من نەبوومەتە بەربەست لەبەردەم ژیانی ئەواندا؟ ئەگەر ڕزگاریان کەم چۆنە؟ مام کوێخا لەوەڵامدا گوتی: بڕیارێکی چاکە کوڕم. پاشان هەردی لە گەڵ مام کوێخا دەچێتە گوندەکەیان لەوێوە خێزانی کەروێشکەکە ئازاد دەکات و دڵخۆش دەبێت و سوپاسی مام کوێخا ڕەسەنیش دەکات.







گۆڤارێکی مانگانەی منداڵانە
ڕۆژنامەی (خەبات) دەری دەکات

خاوەنی ئیمتیاز
**عەلی عەبدوڵڵا**

سەرنووسەر
**نەژاد عزیز سورمێ**

**ناونیشان**
**هەولێر - تەنیشت سەرۆکایەتی زانکۆ**
**تەلەفۆن:** 2220506
Email: helana_xebat@yahoo.com

Helanayi Mindalan
Govareki Zarokane Rojnama
Xebat Deredexit

**Serniviskar**
**Nazhad Aziz Surme**

چاپخانا خانی/ دهوک

# جزدانی ونبوو

وەرگێڕانی: هێلانەی منداڵان

لەشاری ئالیمتیکۆی پورتوگالی بازرگانێکی دەوڵەمەندی چاوبرسی هەبوو، هەرچەندەی سامانەکەی زیاتر دەبوو، زیاتر دەست بگرو قرچۆک تر دەبوو. هەردەم بیری لەوە دەکردەوە پارە و زێڕەکانی زیاتر بێت. ڕۆژێکیان کە بەرەو ماڵ دەگەڕایەوەو لە کاروانێکدا 400 لیرەی زێڕی قازانج کردبوو، لە ڕێگا بیری لەوە دەکردەوە چۆن سبەی هەمان کار بکات و بەهەمان دەستکەوتیشەوە بگەڕێتەوە. ئەو لە خەیاڵی خۆیدابوو لەپڕ جزدانەکەی بەردەبێتەوە. کە گەڕایەوە ماڵەوە بینی پارەکەی ونکردووە، خەریک بوو عەقڵی لەدەست بدات، ئەو شەوە خەو نەچووە چاوی، بەیانییە زووەکەی بۆلای دادوەری شار چوو، بەپاڕانەوە داوای لێکرد و گوتی: گەورەم تۆ ڕزگارکەری لێقەوماوانی، لەو مەینەتییە بە هانام وەرە و فەرمانێک دەربکە، هەرکەسێک جزدانەکەمی دۆزیوەتەوە کە 400 لیرەی زێڕی تێدایە بۆم بهێنێتەوە، من 40 لیرەی زێڕی وەک پاداشت پێدەدەم. دادوەر بەزەیی پێداهاتەوە و بڕیاریدا لە هەموو کوچەو کۆڵانێکی شار جاڕ بدرێت. پاش تێپەڕبوونی سێ ڕۆژ ئافرەتێکی بەساڵاچوو بەرەو لای دادوەر چوو، جزدانە دۆزراوەکەی پێدا. بازرگانەکە بانگ کراو و خەریک بوو لەخۆشییان باڵ بگرێت. کە جزدانەکەی کردەوە و لیرەکانی ناوی ژمارد بینی 400 لیرەی تەواوە، بەڵام پێی ئەستەم بوو پاداشتەکە بە ئافرەتەکە بدات، بۆیە کەوتە بیانوو و گوتی: جگە لەو 400 لیرەیە من 40 لیرەی دیکەشم لەناو دانابوو، بەڵام دیارنەماوە. ئافرەتەکە بە هێمنی گوتی: گەر مەبەستم بردنی پارە با، دادوەری بەڕێز، هەرگیز ئەو جزدانەم نەدەهێناوە.قسەکانی سوودی نەبوو چونکە بازرگانەکە بەهەموو شێوەیەک قسەی ناخۆشی پێدەگوت. دادوەر لە مەبەستی بازرگانەکە گەیشت کە دەیویست پەشیمان بێتەوە لە بەخشینی پاداشتەکەی، بۆیە جزدانەکەی لە بازرگانەکە وەرگرت و پرسی: تۆ دڵنیایت لەناو جزدانەکەت جگە لە 400 لیرە 40 لیرەی دیکە هەبوو؟. بازرگانەکە بە پەلە وەڵامی داوە: بەڵێ جەنابی دادوەر. دادوەر بە تووڕەیی گوتی: بۆچی زووتر ئەو ڕاستییەت نەگوت، ئەو جزدانە هەرگیز هی تۆ نییە، من چەند ڕۆژێک لەمەوبەر جزدانێکم ون کرد کە 400 لیرەی زێڕی تێدابوو، کەواتە ئەوە جزدانەکەی منە، ئافرەتە بەڕێزەکە، گوێ بگرە بەخشین تەنیا لە مرۆڤی چاوتێر دەبینرێت نەک لە دەستگری قرچۆک، منیش بڕیار دەدەم ئەو جزدانە بە تۆ ببەخشم. بەوجۆرە بازرگانەکە بە دەست بەتاڵی گەڕایەوەو بوو بە مایەی پێکەنینی دانیشتوانی شار.



سەرچاوە: ئەلعەرەبی ئەلسەغیر

# خۆزگە ئەسپ دەبووم

نووسینی: ئەسەف عەبدوڵڵا
وەرگێڕانی: هێلانە

کاتێک سامان گەڕایەوە ماڵ، هەموو گیانی بە قوڕ بوو، دایکی بەسەرسووڕمانییەوە پرسی: چیت لە خۆت کردووە؟! ڕاکە خۆت بشۆ. بەڵام سامان ڕقی لە خۆ شووشتن بوو، هەموو جار بە زۆری دەیان ناردە سەرشۆرین، لە سابوون دەترسا، چونکە چاوەکانی دەبرژاندەوە. ئەمجارەیان ناچاربوو بەرەو گەرماوەکە بچێت. لەوێدا بەخۆی گوت: خۆزگە ئەسپ دەبووم، ئەوسا بە ئارەزووی خۆم بەناو قوڕ و لیتە دەکەوتم و بەخێراییش ڕام دەکردو گیام دەخوارد، هیچ کاتێکیش ناچار نەدەکرام خۆم بشۆم و سابوون بێزارم بکات. هێندەی پێنەچوو گوتی: نا.. نا.. هەرگیز نامەوێت ئەسپ بم، چونکە بە ئەسپ گالیسکە ڕادەکێشرێت و باری قورسی پێ هەڵدەگرن و تەنانەت لێشی دەدەن، نامەوێت لێم بدرێت... حەزدەکەم سەگ بم، نەخێر منداڵان یاری بەسەگ دەکەن و ئازاری دەدەن، سەگی برسیشم بینیوە پاشماوەی ناو زبڵدانی دەخوارد... بریا پڵینگێکی بەهێز دەبووم و لە هیچ شتێک نەترسابام، بەڵام لە باخچەی ئاژەڵان پڵینگێکم دی باوکم پێی گوتم ڕاوچییەکی ئازا ڕاویکردووە، ئەوسا ڕاوچییان دەتوانن بە گوللەیەک منیش بپێکن و بمکوژن.... نامەوێت بمرم. لەو کاتەدا دایکی سامان خۆی بە ژوورەکە داکرد و پرسی: هێشتا وەستاویت و خۆت پاک نەکردۆتەوە؟ هەموو قسەکانتم گوێ لێبوو، دەی زووکە ئەسپە بچووکەکەم پڵینگە ئازایەکەم بەڵام بە ددانە تیژەکانت وەک پڵینگ زامدارم نەکەی، یا وەک ئەسپی بەهێز لەپێش ئاو و کەفی سابوون ڕانەکەیت. بەو قسانە، دایکی هانیدا و ئەویش توانی وەک ئەسپ و پڵینگ بەرگە بگرێت و لەبەردەم کەفی سابوون بوەستێ، ئیتر لەوساوە حەزی کەوتە سەر پاک و خاوێنی و ڕۆژانە جوان خۆی دەشۆری.

سەرچاوە: لەو کونتو حیسانەن



# دیاری ڕۆژی لە دایکبوون

ئامادەکردنی: نازێ وەهاب

بەیانیەکیان دیکۆری و بۆبی پشیلە پێکەوە نانیان دەخوارد. بۆبی پشیلە بەدەم خۆیەوە گوتی: ئیمڕۆ دەچم بازاڕ دەکەم، دیکۆری هاوڕێی لێی پرسی: بەنیازی چی بکڕیت؟ بۆبی بە پەشۆکاوییەوە گوتی: ئەوە نهێنییە. دیکۆری بیری کردەوە لەوەی کە ڕۆژێکی خۆش بەسەردەبەن، بەتایبەت کە بۆ بەیانی ڕۆژی لەدایک بوونی ئەو بوو، وا هەستی کرد کە دیارییەک بۆ ئەو دەکڕێت، پاشان وای پێشاندا گرنگی پێ نادات و گوتی: هەمووی مەخۆ، چونکە هێشتا نانەکەم تەواو نەکردووە. پاش نانی بەیانی بۆبی پشیلە جانتای پارەی دەرهێنا،و دەیزانی چەند پارە بەتەواوەتی لەناو جانتاکەدا هەیە کە ئەویش 35 دینارە بوو. ئەوەش بێگومان پارەیەکی تەواوە بۆ کڕینی دیاری لەدایک بوون. بۆبی پشیلە سەرێکی هێنایە ژووری چێشت لێنانەوەو گوتی: دیکۆری من ڕۆیشتم. دیکۆری کتێبێکی کێک دروست کردنی بەدەستەوە بوو، لەو کاتە شاردییەوە بۆ ئەوەی بۆبی هەستی پێنەکات، پاشان بیری کردەوە هەندێک خواردنی تریش بۆ بەیانی دروست بکات، چونکە بۆی دەرکەوت کە بۆبی پشیلە کێکەکەی بۆ دروست کردووە. بۆبی پشیلە بیری لەباشترین دیاری کردەوە بۆ جەژنی لەدایک بوونی دیکۆری و گوتی: ئەو هەموو کەرەستەکانی وەرزشکردنی هەیە، بۆیە پێویستە بیر لەشتێکی نوێ بکەمەوە. لەڕێگادا کاتێک پردە بچووکەکەی ڕوباری دەبڕی بیری لەبەلەم کردەوە، بەڵام دیکۆری دوو بەلەمی هەبوو. پاشان بارابای بینی کە پایسکیلی لێدەخوڕی بۆیە لەبرخۆیەوە گوتی: حەزدەکەم پایسکیلێک بۆ دیکۆری بکڕم، بەڵام دەترسم نرخەکەی زیاتر لە 35 دینار بێت. ئەو کاتەی گەیشتە مارکێت بینی پڕە لەشتی جوان، ئینجا بەخۆی گوت: شکولاتەو شیرینی ناکڕم چونکە دوایی هەمووی خۆم دەیخۆم، دوای ئەوە هەندێک کڵاوی کوڕانی بینی بەڵام دڵنیا نەبوو لەقەبارەی سەری دیکۆری تاکو بۆی بکڕێت.

لەبەشێکی تری سوپەرمارکێتەکەدا کەرەستەی باخچە ئاودان و عەرەبانەی خۆڵی لێبوو. پاشان بۆبی بیری کردەوە کەوا دیکۆری بۆ باخچەکەی حەز بەعارەبانەی خۆڵ هەڵگرتن دەکات، بەڵامبۆی دەرکەوت کە بە 90 دینارە و بەڵام ئەو تەنها 35 دیناری پێیە. پاشان بۆبی بەناو سوپەرمارکێتەکەدا بۆ دیارییەکی شیاو زۆر گەڕا تا بۆ جەژنی لەدیک بوونی دیکۆری بیکڕێت. فرۆشیارەکەش زوو زوو هاواری دەکرد: هەوڵدە بڕیاربدەی کامە ڕەنگت دەوێت، ئینجا بۆبی گوتی: ئەوە بە 90 دینارە، ئایا هی هەرزانتر هەیە؟ پاشان فرۆشیارەکە گوتی: ڕاستییەکەی هەیە، ئەمەیان تۆزێک کۆنە بەڵام هەندێ بۆیەی سووری لێ دەدەم. ئەو کاتەی بۆبی هاتەماڵەوەو دیارییەکەی لەپشتەوەی ماڵەوە شاردەوە پاشان دیکۆری دەرگای کردەوە و گوتی: ئایا نهێنییەکەت کڕی؟ ئەویش گوتی: چاوەڕێ بکە و ببینە، پشیلە جگە لە جانتای پارەکە کە بە بەتاڵ بوو هیچ شتێکی تری پێ نەبوو.





بۆبی بۆ نانی ئێواره تەنها پەرداخێک شیری خواردەوەو دیکۆریش ئارەزووی خواردنەوەی شەربەتی کرد. هەروەها هەندێک لەو مورەبایەیان خوارد کەوا بۆ ئاهەنگەکەی ڕۆژی دواتر نەدەگونجا. کاتێک بەیانی داهات پشیلە لەخەو هەڵسا بینی دیکۆری لەخەو هەڵنەستاوە، بۆبی پشیلە لەبەر خۆیەوە گوتی: عەرەبانەکە لەلای مێزی نانخواردنی بەیانییەوە دادەنێم.

بەیانییەکی زۆر خۆش بوو و ئاسمان گەش و گوڵەکان لە باخچەکەدا دەگەشانەوە. ئەو کاتەی بۆبی ویستی بچێت عەرەبانەکە بهێنێت، بینی لەوێ نەماوە! هەموو جێگاکان گەڕا بەڵام نەیدیتەوە، ئینجا دیکۆری گوتی: چی بووە، شتێکت ون کردوە؟ ئەویش وتی: بەڵێ دیاری جەژنی لە دایک بوونت، شاردبوومەوە بەڵام لە هیچ جێگایەک نەماوە. دیکۆری لەگەڵی گەڕا بەڵام بێگومان نەیدەزانی بەدوای چیدا دەگەڕێت؟ ئینجا بۆبی گوتی: گەورە و سوورە؟، بەڵام ناتوانم پێت بڵێم چییە چونکە ئەوە نهێنییە. کابرای پۆستەچی وتی: سڵاو دیکۆری ئەوە چەند کاتژمێرێکە لە دەرگاکەت دەدەم، بەڵام تۆ نووستبووی من بۆ دیکۆری دیاریی زۆرم پێبوو، بۆیە عەرەبانەیەکم لە باخچەکە دەرهێنا تاکو دیاریەکانی تێبکەم.

کاتێک بۆبی چووە ژوورەوە بینی عەربانەکە پڕە لە دیاری و ئینجا دیکۆری گوتی: لە ژیانم ئەوە جوانترین دیاری نهێنییە، بۆبی پشیلە بە هاوارەوە گوتی: جەژنی لە دایک بوونت پیرۆز، هەروەها کابرای پۆستەچی وتی: جەژنی لە دایک بوونت پیرۆز، بەڵام جارێکی تر ئەوەندە مەخەوە.



سەرچاوە: nursery stories

# داهێنراوەکان

## حاسیبە 1642

حاسیبە ئامێرێکە بۆ ئەنجامدانی کردارە ماتماتیکییەکان بەکاردێت. بە هۆی دوگمە بچووکەکانی ئەلیکترۆنی لەسەرە بۆ کردارەکانی(کۆکردن، کەمکردن، لێکدان، دابەشکردن). هەروەها دەتوانێت جۆری زەحمەتتر لە زانستی ماتماتیک ئەنجامبدات، وەک دیاریکردنی ڕێژەی سەدی، ڕەگی دووجا.



جێگای شانازییە کە(بلەیس پاسکال) یەکەم حاسیبەی میکانیکی داهێناوە.لەساڵی 1642 لە تەمەنی 18 ساڵی بۆ یارمەتیدانی باوکی کە باج کۆکەرەوەیەکی فەڕەنسی بوو ، یەکەم حاسیبەی ژمارەیی داهێناکە پێیدەگوترا پاسکالین تاکو باجەکانی پێ ئەژمار بکات. پاسکال لە 19ی حوزەیرانی 1623 لە کلێرمۆنت هاتوتە دونیا و ڕۆژی 19ی ئابی 1662 کۆچی دوایی کردووە لە پاریس. یەکەم حاسیبە کە بۆ فرۆشتن دانرا لە وڵاتی ئینگلتەڕا دروستکرا لە ساڵی 1961 لەلایەن (سەن لووک کۆمتومێتر). حاسیبەی جیاواز هەیە بۆ بەکارهێنانی جۆراوجۆر، وەک حاسیبەی زانستی، کە پێدادەگریت لەسەر بەرەو پێش چوونی بیرکاری وەک زانستی سێگۆشەکاری و زانستی ژمێریاری.






## خوێی ئیپسۆم 1698

خوێی ئیپسۆم لە مەگنیسیۆم و سۆلفات پێکدێت، ئەم خوێیە بۆ توانەوەی چەوری ناو پێست بەکاردێت. هەروەها بۆ هێورکردنەوەی هەوکردنی جومگە و لەنگی.



نێهێمیا گرووی ڕووەکناس و فیزیاناسی ئینگلیزی. لەساڵی 1698 ڕێگایەکی بۆ ئامادەکردنی ئاوی پاک داهێنا کە ناوی نا خوێی ئیپسۆم، دوای ئەوەی ئاوی کانزایی بەکارهێنا لەو کانییەی کە ئەو خوێیەی لێبەرهەمهێنا. ئەم داهێنەرە ساڵی 1641 لە ئەفێرستۆن ورکشایەر لەدایکبووە ورۆژی 25 ئازاری ساڵی 1712 لە لەندەن کۆچی دوایی کردووە.








## پیانۆ 1709

پیانۆ ئامێرێکی موسیقییە، بەهۆی کیبۆردێک کاردەکات کە بە لێدان لە ژێی ستیلی بە هۆی چەکوشی لبادی، دەنگەکەی بەرهەم دەهێنێ. چەکوشەکە لێدانە دووبارەبووەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە بۆ بەردەوامی لەرینەوە دووبارەبووەکان. دەنگدانەوەکانیش بەهۆی پردێک بۆ (بۆردی دەنگ) دەگوازرێتەوە کە دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی دەنگە لەریوەکان. پیانۆی نوێ ساڵی 1709 لەلایەن بارتۆ لۆمبۆ کرلیستۆفەر دی فرانسیسکۆ داهێنرا. ئەم داهێنەرە کە دروستکەری ئامێرە موسیقایەکان بوو، لە ڕۆژی 1655 لە ئیتاڵیا هاتەبوون و ڕۆژی 27ی کانوونی دووەمی ساڵی 1731 مردووە. پیانۆی نوێ بە گشتی دوو جۆرە پیانۆی گەورەو پیانۆی ستوونی (وەتەر ستوونی).







## گەرمی پێو 1714

گەرمی پێو ئامێرێکە بۆ پێوانەکردنی پلەی گەرمی بەکاردێت. گابرێل دانیال فەهرەنهایت زانایەکی ئەڵمانی بوو ساڵی 1714 یەکەم گەرمی پێوی جیوەیی داهێنا.

پێشتریش کهولی بۆ ئەم مەبەستە بەکارهێنا، بەڵام دواتر دەرکەوت ئەنجامەکانی جیوە وردترە. زۆربەی گەرمی پێوەکان لەسەر ئەو بنەمایەن، مادەکان کە گەرم دەبن دەکشێن. گەرمی پێوی پزیشکی لە بۆرییەکی شووشەی باریک پێکهاتووە کە جیوەی تێدایە، جیوەکە کە گەرم دەبێت بەناو بۆریەکە دەکشێت و بەرز دەبێتەوە و پێوەرەکانی سەر بۆریەکەش پلەی گەرمییەکە دیاریدەکەن. گابریال دانیال فەهرەنهایت ڕۆژی 24ی مایسی ساڵی 1686 لە پۆڵۆنیا هاتووتەبوون و ڕۆژی 16ی دیسەمبەری ساڵی 1736 کۆچی دوای کردووە.












سەرچاوە: کتێبی داهێنەرەکان

# ئامۆژگاری

پڕە لە پارە.

بەو پارەیە زۆر
شت دەکڕم.

نەخێر کوڕم ئەو پارەیە
هی تۆ نییە.

باوکە لە ڕێگا
دۆزیمەوە! هی منە.

هی تۆ نییە، پێویستە
بۆ خاوەنەکەی
بگەڕێنیتەوە.

جا چۆن بزانم
خاوەنەکەی کێیە؟

بە دوایدا
بگەڕێ.

شار گەورەیە
چۆن بگەڕێم؟


با دەزگاکانی ڕاگەیاندنی لێ ئاگادار بکەینەوە.
من ئەوە ناکەم.
ئەی دەتەوێت چی بکەیت؟
دەمەوێت لەسەر کاغەزێک بنووسم و بەدارەکەوە هەڵیبواسم.


هەرکەسێک جزدانێک پارەی لێرە ون کردوە با پەیوەندی بەو ناونیشانە بکات :-


باوکە ئەگەر هەر خاوەنی نەبوو؟
بێ خاوەن نییە.

# کشتووکاڵ لە ئایندەدا

ساڵی 2050 مرۆڤ پێویستی بە دوو هێندەی بەرهەمی کشتوکاڵی ئێستای دەبێت، تاکو بتوانێت پێویستییەکانی دابین بکات. لە ئایندە گرفتی دەست کەوتنی بەرهەمە رووەکییەکان زیاتر دەبێت، بەهۆی کەمبوونەوەی رووبەری زەوی و بەکارهێنانی بۆ مەبەستی نیشتەجێبوون، بۆ چارەسەرکردنی ئەم کیشەیە لە ئێستاوە بیر لە چەندان رێگای دیکە کراوەتەوە لەوانە:



## کشتوکاڵ کردن لە بیابانەکان

هەوڵ دەدرێت بیابانەکان بکرێن بە مێرگی سەوز. بۆ ئەم مەبەستە ئامێر و ئامرازی وەها بەکاربهێنرێت تا کشتوکاڵ کردن لەو زەوییە فراوانانە بکرێت، لەوانە سوود وەرگرتن لە ئاوی ژێر زەوی و بەکارهێنانی سیستەمی ئاودانی قەترەیی و چاندنی ئەو جۆرە بەروبوومانەی کەدەتوانن لەگەڵ ژینگەی بیابانی بگونجێن.

## کشتوکاڵ کردن بە ئاوی دەریا

لەبەر ئەوەی لە ئاینده جیهان زیاتر بەدەست گرفتی ئاوی شیرن دەناڵێت، بۆیە زانایان بیر لە بەکارهێنان و سوود وەرگرتن لە ئاوی دەریا دەکەنەوە کە بە رێگای نوێ پاک بکرێتەوەو بۆئەو بەرهەمانە بەکاربهێنرێت کەبەرگەی ئاوی سوێر دەگرن.

## کشتوکاڵ کردن بە تەکنۆلۆژیای نوێ

جگە لە ژووری شووشەیی، هەوڵ دەدرێت تەکنەلۆژیای نوێش لە شێوەی رۆبۆت و کومپیۆتەر و مانگی دەستکرد بەکاربهێنرێت بۆ کشوکاڵ کردن.

## کشتوکاڵ کردن لە ئاسمان

حاڵی حازر لە بنکەی ئاسمانی نێودەوڵەتی لەبەرزایی 390 کیلۆمەتر لە دووری زەوی، تاقیکردنەوە دەکرێت لەسەر چاندنی چەندان بەروبووم، لەم شوێنە ئاو لە شێوەی چڕکردنەوەی هەڵمی بەرهەمهاتووی ئاووهەوای دەستکردی ناو وێستگەکە دەست دەکەوێت.

سەرچاوە: گۆڤاری ماجید

# تونێلی دەریای مانش

تونێلی دەریای مانش بریتییە لە ڕێڕەوێکی ژێر دەریا کە درێژییەکەی 5.5 کیلۆمەتر دەبێت، لە دوای تونێلی سیکانی وڵاتی ژاپۆن، بە دووەم تونێلی درێژ دادەنرێت، ئەم تونێلە کەنارەکانی باکووری وڵاتی فەرەنسا بە کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی بەریتانیا دەلکێنێت. قوڵایی دەگاتە 75 مەتر.





ئەو بەشەی کە دەکەوێتە ژێر ئاو 37.9 کیلۆمەتر دەبێت، ئەمەش درێژترین بەشی ژێر ئاوی هەموو تونێلەکانی جیهانە. بیرۆکەی لێدانی ئەم تونێلە بۆ ساڵی 1802 دەگەڕێتەوە، لە ساڵی 1881 هەردوو وڵاتی فەرەنسا و بەریتانیا لەسەر ئەنجامدانی ئەم پرۆژەیە ڕێککەوتن، بەڵام هەر زوو بەریتانیا کارەکەی ڕاگرت لەبەر بوونی مەترسی بۆ سەر ئەمنی قەومی خۆی. لەساڵی 1985 هەردوو وڵاتەکە ڕێککەوتنێکی دیکەیان مۆرکرد و لەساڵی 1988 تونێلەکە لێدرا و لەساڵی 1994 کارەکە بە کۆتا گەیشت و 4650 ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی تێچووە.

ئەم تونێلە لە سێ ڕێڕەو پێکدێت، دووانیان شەمەندەفەریان بەناودا ڕەت دەبێت، ڕێڕەوەکەی دیکەیان تایبەتە بە پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریەکان. تونێلەکە مەترسی بۆ سەر ژینگە نییە، وەها داڕێژراوە کە پلەی گەرمی لە 30 پلەی سەدی زیاتر نەبێت، لەڕووی تەندروستیشەوە پارێزراوە و بەردەوام هەواکەی پاکدەکرێتەوە. شەمەندەفەرەکانی ناوی بە کارەبا کاردەکەن و لەسەر سیستەمێکی هەستیاری ئۆتۆماتیکی دەکەونە جوولە. ماوە بڵێین کە ساڵانە 18 ملیۆن کەس پێیدا ڕەت دەبن، لەگەڵ بڕێکی زۆری کاڵای جۆراوجۆر، جۆرێک لە بووژانەوەی ئابووری و گەشتیاری بە ناوچەکانی هەردوو بەر دەگەیەنێت.




سەرچاوە: گۆڤاری ماجید

# ئەو ئاژەڵانەی بەرەو بۆشایی ئاسمان نێردران

ئاژەڵان ڕۆڵی گەورەیان گێڕاوە لە بەدیهێنانی خەونی کۆنینەی مرۆڤ لە گەیشتن بە ئاسمانی دەرەوە، ئەوان پێش مرۆڤ گەشتییان کرد و بوون بە ڕێگا خۆشکەر. هەندێکیان گەڕانەوەو ناویان دەرکرد، هەندێکیشیان تا ئێستا لە بۆشایی گەردوون وێڵن.



بەر لەوەی مرۆڤ گەشتی درێژ بۆ ئاسمانی دەرەوە بکات، پێویستی بە دڵنیایی بوو لە کاریگەری گەشتەکە بەسەر جەستەو توانای ئەندامەکانی، بەتایبەت کاریگەری نەمانی کێش و بەرکەوتن بە تیشکە گەردوونییەکان. لەساڵانی چلەکانی سەدەی ڕابردوو، پاش ڕاهێنان و تاقیکردنەوە، چەندان ئاژەڵ و قەوزە بەرەو ئاسمانی دەرەوە نێردران. ساڵی 1957 کەشتی (سپوتنیک 2) بۆ یەکەمین جار سەگێکی نارد کەناوی (لایکا) بوو تا بەدەوری زەویدا بسووڕێتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کەشتییەکە نەگەیشتەوە زەوی، بۆیە لایکا نەگەڕاوە و وێنەکەشی بەناو جیهاندا بڵاوبۆوە. لەساڵی 1961 پاش ڕاهێنانێکی زۆر، شامپانزییەک کە ناوی (هام) بوو بە کەشتییەکی ئەمەریکی گەیشتە ئاسمانی دەرەوە، هەر لەو ساڵەدا کەشتی (ڤۆستوک 3 ئەی) سۆڤیەتی کۆمەڵێک مشک و بۆقی نارد.

لەساڵی 1963 زانایان پشیلەیەکیان نارد کە جەمسەرێکی ئەلیکترۆنی لەسەری چاندرابوو، بۆ ئەوەی لە کاتی گەشتەکە ترپەی دەماری بپیوێ. ساڵی 1969 ئەمەریکییەکان مەیموونێکیان نارد کەناوی (بۆنی) بوو ئەمەش بە یەکەم ئاژەڵ دادەنرێت کە زیاتر لە ڕۆژێک لە ئاسمانی دەرەوە مابێتەوە. هەموو ئەو هەوڵانە بوون بە ڕێگا خۆشکەر لەبەردەم مرۆڤ بۆ ئەوەی بەرەو بەرزایی ئاسمانە دوورەکان بچێت.

**سەرچاوە: گۆڤاری ماجید**

# مەرەکەب چییە؟

مەرەکەب بۆیەیێکی شلە بۆ ڕەنگ کردن و نووسین و نیگارکێشان و دیزاین و تەنانەت جۆری وەهاشی هەیە کە بۆ چاپکردن و هونەری گرافیک بەکاردێت. زۆربەی شارستانییەتە دێرینەکان مەرەکەبیان بۆ نیگار و نووسین بەکارهێناوە، لەوانە میسرییە دێرینەکان 3 هەزار ساڵ پێش زایین و دواتریش هیندییەکان لە ئێسکی سووتاو و قەتران و چەندان ماددەی دیکە مەرەکەبیان دروست کردووە، لەسەدەی پازدەهەمیش گۆتەنبێرگی داهێنەری چاپخانە جۆرە مەرەکەبێکی وەهای داهێنا کە بۆ چاپکردن بشێت.



سەبارەت بەو پێنووسانەی کە بە مەرەکەب دەنووسن ئەوە لە سەدەی دەیەمی زایینی داهێنران، کە هەر جارەی مەرەکەبەکەی وشک دەبوو پڕ دەکراوە، لەسەدەی ڕابردووش پێنووسی مەرەکەبی وشک (جاف) داهێنرا، کە ئەمەیان خەرجی تێچوونی کەمترەو نرخەکەشی کەمترەو پێویستیش بە پڕکردنەوە ناکات. دەبێت ئاگاداربین مەرەکەب شوێنەواری خراپی بۆسەر ژینگەو تەندروستی هەیە، تووشی سەرئێشەو هەستەوەری پێست و تێکچوونی خانەکانی کۆئەندامی دەمارمان دەکات، چونکە توخمی وەهای تێدایە بەخێرایی وشک دبن و لەناو هەوا بڵاودەبنەوە. جۆرە مەرەکەبێکی دیکە هەیە پێیدەگوترێت (مەرەکەبی هەڵبژاردنەکان) ئەمەیان بۆ دەنگدەرەکان بەکاردێت کە ماددەیەکی تێدایە تا تێپەڕبوونی 24 کاتژمێر ڕەش نابێتەوە. مەبەست لەمەش پاک ڕاگرتنی کرداری هەڵبژاردنەکانە.

سەرچاوە: گۆڤاری ماجید

# خـواردنـەوە و چـێشت لێنـان

**ئاوی خواردنەوە:**

جگە لە هەوا، ئاویش ژیان بە مرۆڤ دەبەخشێت. هەروەها یارمەتیمان دەدات لە نەهێشتنی ئاوێتە کیمیاییەکان. کاتێک ئاو دەخۆینەوە کە هەست بە تینویەتی بکەین. مرۆڤێکی پێگەیشتوو لە ماوەی ژیانیدا پێویستی بە 60000 لیتر ئاوهەیە. ئەو ئاوەی ئێمە دەیخۆینەوە، بەشێکی گرنگی خۆراکمانە، لە چەندان ڕێگاوە سوود بە لەشمان دەگەیەنێت، لەوانە:



1- تینویەتیمان دەشکێنێ.
2-بەسوودە بۆ لادانی چەوری ناو لەش.
3-سیستەمی هەرس پاک دەکاتەوە.
4-خوێن سووک دەکات تا بە ئاسانی بەناو هەموو بەشەکانی لەش بسووڕێتەوە.
5- پلەی گەرمی لەش ڕێکدەخات.
6-ئەو کانزا بەسوودانە بە لەش دەبەخشێت کە پێویستی پێیەتی. لەوانە کانزای فلۆرید.
7-ماسوولکەکان دەپارێزێت و بەیەکەوەیان دەلکێنێ لە کاتی ئەنجامدانی فەرمانەکانیان بە شێوەیەکی نەرم.

## چێشت لێنان

ئاو لە چێشتخانەکان بەکاردێت، خواردنەوە گەرمەکانی وەک چا و قاوە بە ئاوی گەرم ئامادە دەکرێت، برنج و گۆشت و خۆراکەکانی دیکەش بە ئاو لێدەنرێن، بۆ دروست کردنی نانیش ئاو پێویستە، هێلکەش لەناو ئاو دەکوڵێت.





شەعرییە



بیر

* خواردنە تایبەتییەکانی وەک مەعکەرۆونە و تێکوشەو لە قوتوونراوەکانیش پێویستییان بە ئاوە. هەموو ئەو ئاوانەی دەیانخۆینەوە سەرچاوەکانیان بیر و کانی و ڕووبارەکانە. بە گشتی ئاوی ڕووبارەکان بۆ خواردنەوە لەبارنییە، چونکە زۆر شتی تێدایە، بۆیە پێویستە بە ڕێگای کیمیایی پاک بکرێنەوە بۆ لابردنی ماددەکان و شیاندنیان بۆ خواردنەوە.

**ئایا دەزانی؟**

خواردنەوەی ئاو بە ڕێژەیەکی زۆر و خێراییەکی زۆر دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ڕێژەی سۆدیۆم لە بۆڕیەکانی خوێن و لاسەنگ بوونی ئاو لە ناو میشک!





پەمبی دەستی

سەرچاوە: کتێبی ئاو

# چۆن زیادبوونی دانیشتووان زیان بە ژینگە دەگەیەنێت؟

زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان پێویستی بە کارگە و وێستگەی بەرهەم هێنانی وزەی کارەبای زیاتر هەیە، بەمەش ئاستی مادده کیمیاییەکان و ئەو گازانەی لە کارگەکان و وێستگەکان دەردەچن زیاتر دەبێت و ژینگە زیاتر بەرەو پیسی دەچێت.





کاتێک کە ژمارەی دانیشتوان بەخێرایی زیاد دەبێت، مروڤ پێویستی بە خاکی زیاتر دەبێت بۆ نیشتەجێبوون، کەواتە ناچار دەبێت لە زەوی نەشیاو بژییێت و شوێنە بێ فەڕەکان بەکار بهێنێ.



زۆر بوونی دانیشتوان لە هەموو شوێنێک گرفتی کەم بوونەوەی ئاوی بە دوا دادێت.



بەمەبەستی دابین کردنی بڕێکی زۆری بەرهەم، جوتیارەکان ناچارن زیاتر پەینی کیمیایی و ماددەی دیکەی کیمیایی بۆ لەناوبردنی جانەوەر بەکاربهێنن. ئەمانەش دەبنە هۆی پیس بوونی ئاو و لەناوبردنی سامانی ماسی و زیانگەیاندن بە بوونەوەران و پیس کردنی ژینگە.











که ژمارەی دانیشتوان لە زیادبووونداببێت، گوندنشینان بە لێشاو کۆچ بۆ شارەکان دەکەن، جا ئەگەر دەسەڵاتداران نەتوانن خزمەتگوزاری تەندروستی پێویست پێشکەش بکەن، ئەوە ڕووبارەکان پیس دەبن و گیانەوەرانی ناویان بەرەو کەمبوونەوە دەچن.



زۆربەی دارستانەکان براون، دارەبڕاوەکان بۆ دابینکردنی پێداویستە زۆرەکانی مرۆڤ بەکاردەبرێن، بەمەش تەرازووی سروشت لاسەنگ بووە. باران ڕووی زەوی ڕەدەماڵێت، جیهانی گیانەوەران و ڕووەک دووچاری شلەژان بووە و مرۆڤیش لەبەردەم تووشبوونی چەندان نەخۆشی درێژخایەندایە.





سەرچاوە: کتێبی ژینگە

دەرامەتە سرووشتییەکان سنووردارن، کەچی دانیشتوان بە ڕێژەی زۆر و بە خێرایی زیاد دەبێت و پێویستیەکانیشی بێ سنوورن، کەواتە مەحاڵە ئەو هەمووە خەڵکە بەو دەرامەتە سنوورداره پێداویستییەکانی دابین بکرێت.

# کتێب

کتێب هۆکارێکە بۆ دەربڕینی چیرۆک و زانیاری و وێنە. لە وشەی نوسراو و چاپکراو لەسەر کاغەز پێکدێت، کە کاغەزەکان بەیەکەوە لە چوارچێوەی بەرگێکدان. کتێبی جیاواز ناوەڕۆکی جیاوازی تێدایە. لەکتێبی چیرۆک وێنەکان هەمیشە یارمەتیدەرن بۆ ڕوونکردنەوەی واتای چیرۆکەکان. هەندێک کتێب زۆر ناسراون و بۆ سەر زمانی جۆراوجۆر وەرگێڕدراون.




ئەو کتێبانە بۆ زمانەکانی ئیسپانی و ئینگلیزی و یۆنانی وەرگێڕدراون، تەنیا وشەکانی ناوەوەیان گۆڕاوە.

کتێب لەلایەن بڵاوکەرەوەکان بەرهەم دەهێنرێت، بۆ بەرهەمهێنانیشی کەسانێکی زۆر کاری تێدا دەکەن، کە هەر یەکێکیان کارێکی جیاوازی لە ئەستۆیە.

* دیزاینەر شێوەی کتێبەکە دادەڕێژێت.


Cross reference

**Book**

A book is a way of presenting stories, information, and pictures. It contains words printed or written on pages of paper, which are **bound** together in a cover. Different books tell you about different subjects. In a storybook, pictures often help to tell the story. Some books are so popular that they are printed in many different languages.

▲ This book has been printed in Greek, Spanish and English. Only the words have been changed.

Books are produced by publishers. A lot of people work together at the publishers to make a book. Each person has a different job.

When all the words and pictures are ready, the editor checks that there are no mistakes and sends the book to a printing plant.

Let's say you need 500 copies of a book. At the printing plant, each page of the book is copied 500 times by a machine called a printing press. The paper goes from a big roll into one end of the press. The pages come out at the other end. Another machine cuts them and puts them together in the right order.

▶ A big printing press can print many pages together on the same large sheet of paper.

**Printing**

A printing machine works like a huge rubber stamp although it is more complicated.

Some computer printers use a **laser beam** to print. Light from the laser burns tiny lines onto special paper. The lines make up the shapes of different letters.

The printed pages are glued, stapled, or sewn together. They are given a stiff hardback cover, which lasts a long time, or a cheaper paperback. The books go to a warehouse from which they will go to stores, libraries, homes, and schools.

Look in a library

* هونەرمەند نیگارەکانی ناوەوەی کتێبەکە دەکێشێت.

* نووسەر بیر لە بیرۆکەی کتێبەکەی دەکاتەوە و وشەکانی دەنووسێت.

* کاتێک کە وشەکان و نیگارەکان ئامادە دەبن، نووسەرەکە سەیریان دەکات تا دڵنیا بێت لەوەی هیچ هەڵە و کەموکورتییەکی تێدا نییە، ئینجا بۆ چاپخانەی دەبات.

با وەها دابنێین تۆ 500 کۆپی کتێبێکت دەوێت، لە ناو چاپخانەدا هەر یەک لە لاپەڕەکان 500 دانە چاپ دەکرێت، بە ئامێرێک کە پێیدەگوترێت(printing press ) چەندان لاپەڕە بە یەکەوە و لە شێوەی قەبارەیەکی گەورە بەرەو لایەکی ئەو ئامێرە دەچێت و لە لایەکی دیکەوە دەردەچن، ئینجا بە ئامێرێکی دیکە رەت دەبن کە ئەویان بەپێی ژمارەی لاپەڕەکان دەیان بڕێت و ریزبەندیان دەکات.



**ئامێری چاپکەری گەورە دەتوانێت لە یەککاتدا لەسەر پارچە کاغەزێکی گەورە ژمارەیەکی زۆر لاپەڕە چاپبکات.**

## چاپکردن

* ئامێری چاپکردن وەک (ستامپا) کاردەکات بەڵام زۆر ئاڵۆزە.



* هەندێک لە چاپکەری کۆمپیوتەر بۆ چاپکردن، تیشکی لێزەری بەکاردەهێنێ، رووناکی لێزەرەکەی خەتە بچووکەکان دەسووتێنێ لەسەر کاغەزە تایبەتییەکانی ناوی، بەمجۆرە کۆپییەکە دەردەچێت.




* کاغەزە چاپکراوەکان بەیەکەوە دەلکێندرێن و لەناو بەرگێکی توند دەنرێن تا بۆ ماوەیەکی درێژ بەرگە بگرێت، دواتر بەرەو شوێنی جیاواز دەنێردرێن لەوانە کتێبخانەکان، قوتابخانەکان، ماڵەکان.

## ئاوڕدانەوەیەک لە کتێبخانە

لەناو کتێبخانە کتێبەکان بە شێوەی تایبەت پۆلین کراون. ئەوەی دەتەوێت بەگوێرەی ناونیشانەکان دەتوانیت بیدۆزیەوە. کتێبی چیرۆک لە بەشی چیرۆک دانراوە، کتێبەکانی دیکەی وەک ئینسکلۆپیدیا لەو شوێنانە نین کە تایبەتن بە چیرۆک.

# The Earth and the Sky

## زەوی و ئـاسـمـان



**Clouds**

**هەورەکان**



**Earth** زەوی



**Mountain**

**شاخوداخ**



**Forest** دارستان



**Lightning** هەورەبروسکە



**Wind** ڕەشەبا



**Desert** بیابان



**Eclipse** مانگ گیران



**Rain** باران



**Iceberg** بەستەڵەک



**River** ڕووبار



**Moon** مانگ



**Storm** گەردەلوول



**Sun** خۆر



**Volcano** بورکان



**Pond** گۆماو



**Rainbow** پەلکەزێڕینە



**Stars** ئەستێرەکان



**Cave** ئەشکەوت



**Waterfall** تاڤگە



**Pasture** لەوەڕگا

سەرچاوە: کتێبی هەزار وشە

# بارین و دارسێو



نووسینی: شەڤین شڤان عەزیز

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو، کچێکی جوانکیلەی تەمەن 9 ساڵان هەبوو ناوی بارین بوو، برایەکیشی هەبوو ناوی بارز بوو. کاتێک بارز لەسەر جۆلانەکەی بوو بارین ئەوەندی پاڵ پێوەنا تا ماندوو بوو، بۆیە لە ژێر دارسیوەکەدا دانیشت تا پشووبدات.

سەگەکەشی کە ناوی بۆبی بوو، لە تەنیشتیەوە ڕاکشا. بارز بە بێزارییەکەوە گوتی: ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر گەرمە، بارز تکای کرد لە بارین و گوتی: وەرە با یارییەکەمان تەواو بکەین. بارین لەوەڵامدا گوتی: نایەم و هیلاکم دەمەوێت بڕۆم یارمەتی دایکم بدەم لە کۆکردنەوەی جلە شۆراوەکاندا کە بە تەنافەکەوەن. دایکی گوتی: بارین با زوو کەین، سەیری ئەو هەورە ڕەشە بکە، بایەکە لە باران و تۆفان ئاگادارمان دەکاتەوە. بارین هاواری کردو گوتی: بارز وەرە تۆش یارمەتیمان بدە، پیش ئەوەی باران سەرلەنوێ جلەکان تەڕ بکاتەوە، ئەوە لە کوی خۆت شاردۆتەوە!؟ بارین لە پشت چەرچەفە سپییەکەوە خۆی شاردبووەوەو دەنگێکی ترسناکی لێوە هات: هو هو، من جنۆکەم. بۆبی سەگ دەستی بە وەڕین کردو ویستی هێرشی بکاتە سەر. بارین بە پێکەنینەوە گوتی: واز لەم بەزمە بینە دەبیت زوو جلەکان کۆکەینەوەو بچینە ژوورەوە سەیری ئەو هەورە تاریکە بکە. دواتر گوتی کوا بۆبی دەبێت بیدۆزینەوە. بارز گوتی: هەر فێرە ئاوا زوو زوو خۆی دەشارێتەوە، ئەوە هاتەوە. پاشان هەموو چوونە ماڵەوە. بارز لەبەر پەنجەرەکەوە گوتی: بارین سەیرکە هەورە برووسکە و گەواڵە چۆن ڕووناکی و دەنگیان دێت. هەرگیز لە گەڵ ئەو ڕەشەبا بەهێزەدا شتی وام نەبینیوە. باڵام بارین لە ترساندا هەردوو گوێی خۆی گرتبوو. دواتر دەنگێکی گەورە هات و بارز گوتی: دیارە ئەوە هەورە بروسکە بوو دای لە دار سێوەکە. دیتیان لق و پۆپی دارسێوەکە هەمووی کەوتبوە سەر زەوی. پاش ئەوەی کەشوهەوا هێمن بووەوە بینیان دارسێوەکە نەماوە. بارین بەمە زۆر دڵتەنگ بوو، بارز و بۆبی هەوڵیان دا دڵخۆشی بکەن بەڵام بێسوود بوو. بارین بەدەم خۆیەوە دەیوتەوە ئەمە بەهۆی ڕەشەباکەوە بوو، چەند گوناحە دارهێوەکە. بارز لەسەر چڵی سێوەکە دەستی کرد بە هەڵبەزو دابەز تا خەندە بگەڕێنێتەوە سەر لێوی بارین. پاش ماوەیەک بارین غەمەکەی لەبیر چووەوەو تووشی سەرسوڕمان بوو. کاتێک بارین چەند پەپوولەیەکی بینی هاتن و لەسەر گوڵی درەختەکان نیشتن گوتی: ئەی خودایە چەند جوانن. بارین هەناسەی خۆی گرت تا پەپوولەکان نەترسن، دواتر گوێی لە وەڕینی بۆبی بوو، کە چووە لای بۆبی بینی لەبەردەم هێلانەیەکدا وەستاوە کە 4 بێچووە چۆلەکەی تازە لەدایکبووی لاوازی تیدایە. دایکی بارین نزیک بووەوەو گوتی: وا باشترە بیچووەکان بخەینە سەر پەلی درەختیکی بەرز چونکە بە مانەوەیان لەسەر زەوی ژیانیان لە مەترسیدا دەبێت. من دڵنیام کە دواتر دایکیان دەیاندۆزێتەوە. بارین و بارز پەیژەکەیان هێناو دایکیشیان بە هێواشی هێلانەکەی خستە سەر دەستی و بە پەیژەکەدا سەرکەوت و لەسەر پەلی درختەکە داینا. دواتر بارز گوتی: سەیرکەن ئەوە دایکیان هاتەوە بۆلایان و خواردنیشی بۆ هێناون. پاشان بارین و بارز لەگەڵ دایکیان بە پێکەنینەوە بەرەو ماڵ گەڕانەوە.



هەریەک لەم وێنانە لە وێنەکەی سەرەوەدا بدۆزەرەوە.





لە نێوان ئەو دوو وێنەیەی سەرەوەدا پێنج جیاوازی بدۆزەرەوە.



بۆ تەواوکردنی ئەم وێنەیە هەموو خاڵەکان بەیەکتری بگەیەنە.



هەموو دوو گوڵە هاوشێوەیەک بە هێڵێک بگەیەنە.




بە ڕێگەی ڕاستدا ئەم باخەوانە بگەیەنەرە گوڵەکە.



## ڕەنگکردن:

1= زەرد، 2=پرتەقاڵی، 3=سوور، 4=سەوز، 5=شین، 6=شینی تێر، 7=قاوەیی، 8=خۆڵەمێشی.